# چل گوڵی گەشاوە

## بۆ دایە و باوە

دانەر

فەلاحی ئەمینی

# ٤٠ گوڵی گەشاوە
# بۆ
# دایە و باوە

دانەر
فەلاحی ئەمینی

هەولێر
چاپی یەکەم
٢٠٠٩

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله الذي لم يتخذ ولدا ولم يكن له شريك في الملك ولم يكن له ولي من الذل وكبره تكبيرا.**

**والصلات والسلام على الذي أرسله الله بشيرا ونزيرا وداعيا الى الله وسراجا منيرا.**

**أما بعد:**

**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾** سورة ال عمران، الاية (١٠٢)

**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾** سورة الاحزاب. الاية (٧٠-٧١).

**﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾**
سورة النسا ، الاية (١).

**ئەی دایکان و باوکان ئەی پەروەردەکارانی نەوەکانی ئایندە ئەی مامۆستایانی قوتابخانەی پەوەردەیی، بەڕاستی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر ئێوەیان بە گرنگ گرتووە چونکە ئەگەر خێرو خۆشیو ئاوەدانی هەبێ بەبۆنەی ئێوەو دەستو بازو ئێوەوە دەبێ. وە ئەگەر شەڕو شۆڕو وێرانی هەبێ هەر لەلای ئێوەوە دەردەچێ.**

**دەی کەوابوو هەولێ ئاوەدانی و بەختەوەری نەوەکانتان بدەن و پەروەردەیەکی جوانیان بکەن. وە ئەوەش بزانن کە پەروەردەی سەرکەوتن و ڕەوشت و ئاکار بەرزی تەنها لای ئەو کەسە دەست دەکەوێ کە زاناو دانایەو دڵسۆزە، ئەویش خوای جیهانیانەو دروست کاری هەموو بوونەوەرە وە**

دورسـتكاری ئێـوەو نەوەكانتانـە، وە بەرنامەكـەی ئـەویش تـەنها قورئـانو فـەرمووده جوانـەكانی پێغەمبـەری ڕەوشـت بـەرزە(ﷺ) وە قورئـان بەرنامـەو كەتەلۆكی ئێمەیەو هەمووبوارەكانی ژیـانی ئێمـەی تێدایـە هـەر لـەبیروباوەڕەوە تـاوەكو ژیـانی شارسـتانیو كۆمەڵایـەتی و ە بـۆ زیـاتر ڕوون بوونـەوەو تێگەیشتن سەیری ئەم چەند ووشەیە بكەن كە دەڵێ (الا لكل صانع مصنوع، ولكل مصنوع مكتوب ولكل مكتوب فيه حقيقة المصنوع من حاد عن هذه الحقيقة يمينا ويسارا فقد خاب وخسارا).

ئاگاداربن بۆ هـەموو دروست كارێك دروست كراوێك هەیە، وە بۆ هـەموو دروست كراوێك نووسراوێك هەیە وە هـەموو نووسراوێكیش ڕاستی بـەیانی دروستكراوەكەی تێدایە، هـەر كەسێك لـەو ڕاستیە لادات بەلای ڕاست دابێت یالای چەپ بەڕاستی ڕەنجەڕۆو ماڵ كاول دەبێت.

كەوابوو بزانن(ان الله خالق ونحن مخلوق والقرآن مكتوب وحقيقة حياتنا في القرآن من حاد عنه يمينا ويسارا فقد خاب وخسارا).

بەڕاستی خوای گەوەر دروست كارەو ئێمەش دروستكراوین وە قورئانیش نووسراوەكەیە وە ڕاستیو بـەیانی ژیـانی ئێمـە لـە قورئاندایـە وە هـەر كەسێك لای دا لەقورئان بـەلای ڕاسـتدابێ یـا لای چـەپ بەڕاسـتی ڕەنجـەڕۆو مـاڵ كـاول دەبێت).

هەروەها خوا دەفەرمووێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ سورة المائدة، الاية (٤٨-٥٠).

وە پێغەمبەر دەفەرمووێ: (دو شتم بۆ بەجێ هێلاون ئەگەر ئێوە دەستان پێوەیان گرت بە ئەبەدی ئێوە لەدوای من گومرا نابن (کتاب الله وسنتي) کتێبەکەی خواو فەرموودەکانی خۆم.

وە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا داوا لە ئێمە دەکات کەسەیری پێغەمبەرەکانی بکەین هەروەکو دەفەرمووێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ سورة الممتحنة، الاية (٦).

دەی کەوا بوو با بچینە خزمەت چەند ئایەتێکی پیرۆز لە قورئانەکەی خودا کە باسی پێغەمبەران دەکات وەك ئەم ئایەتانە.

کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ سورة البقرة، الاية (١٣٢).

ئەی دایکان و باوکان ئێوەش ئەم دوو پێغەمبەرەو باقی پێغەمبەرانی خوا(ع-م) بکەن بە پێشەنگ و مەشخەڵی خۆتان لە دونیادا بەتایبەتی پێغەمبەر (ابراهيم"عليه السلام" ) وە بەتایبەتی تر پێغەمبەری خۆمان محمد (ﷺ) چونکە خوای گەورە لە سورەتی مومتەحینەدا لە ئایەتی (٤) دا دەفەرمووێ: بۆ ئێوە هەیە لە پێغەمبەر ئیبراهیمدا پێشەنگێکی جوان ، دەبێ ئێوەش ئامۆژگاری نەوەکانتان بکەن کە لەسەر ئەم ئیسلامە بژین و بمرن تاوەکو خۆشبەختی دونیاو ڕۆژی دوای بن، وە لە ئایەتی (١٣٣)ی هەمان سوورەتدا خوای گەورە شێوازێك و دیمەنێکی زۆر سەیرو گرنگمان پێ پیشان دەدات و دەفەرمووێ: ﴿ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي﴾ سەیرکەن باوکان بزانن پێغەمبەر یەعقوب (ع-م) چەند لە خەمی نەوەکانیەتی لەسەرە مەرگدا نەوەکانی تاقی دەکاتەوەو لێیان دەپرسێ بزانێ تا چەند ئامۆژگاریەکانی و پەروەردەکردنی نەوەکانی سەرکەوتوی هێناوە، بۆیە لە نەوەکانی دەپرسێ چی و کێ دەپەرستن، لەپاش من ئەوانیش لەوەلامدا ﴿قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَـهَكَ وَإِلَـهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ إِلَـهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ

لَهُ مُسْلِمُونَ﴾البقرة، الاية(١٣٣). وتيان خواى تۆ دەپرسيتن ئەى با بەوە خواى باو باپيرانى تۆ كە ئيراهيمو نيسماعيلو ئيسحاقە كەيەك خوايەو ئێمە خۆمان داوەتە دەستى ئەوو تەسليمى ئەو بوين، كەوا بو ئێوەش ئەى دايكانو باوكان نەوەكانتان فێرى يەكتا پەرستى بكەن چونكە كردەوەى چاك بەبێ يەك خواپەرستى هيچ سوود بە پەرستيارەكەى ناگەيەنێ.

وە ئێوەش ئەى دايكانى ئازيز خێزانى عيمرانى دايكى مەريەم بكەن بە پێشەنگو مەشخەڵى ژيانتانو سەيركەن خوا چۆن ئەم ئافرەتە لەناو كتێبەكەى خۆى دا تۆمار دەكاتو ناوى بەرزدەكاتەوەو دەفەرمووێ: ﴿ إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وِإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاء﴾ال عمران، الاية (٣٥-٣٨). باس بكە ئەى موحەمەد(ﷺ) بۆ گەلەكەت كاتێ خێزانى عيمرانى وتى ئەى پەروەردگارم من كردومە بە قوربانىو خزمەتكارى ماڵەكەت ئەوەى كە لە زگمدايە تاوەكو بە تەنها سەرقاڵى خزمەت كردنى ماڵەكەى تۆ بێو بەندايەتى تۆ بكات تۆش لێم قەبوڵ بكە، چونكە بەڕاستى تۆ بيسەرىو زاناى بەقسەو كردارى من، كاتێ كە داينا وتى ئەى پەروەردگارم من مێينەم داناوە وە خوا زاناترە بەوەى كە دايناوە وەنێرينە وەكو مێينە نيە وە خواى گەورە مێينەى دەوێ بۆ ئەوەى كە خۆى زانيارى پێ هەيە- وە من ناوم لێنا مەريەم وە من پەناى دەدەم بەتۆ لەگەڵ نەوەكانى لەشەيتانێ كە دەركرا وە لە ڕەحمەتو سۆزى تۆ، وە خواى گەورە چونكە ئەو ڕاستگۆ بوو لێى وەرگرت بەلێ وەرگرتنێكى جوانو نەشونمايەكى جوانى بە مەريەم كردو

پێغەمبەر زەکەریای (ع-م ) کرد بە سەرپەرشتیاری، وە هەموو جارێك زەکەریا دەچووە لای لە میحرابا دەیبینی لای مەریەم خواردن وتی ئەی مەریەم ئەوەت لەکوێ بوو ئەویش وتی ئەوە لەلایەن خواوەیە بەڕاستی خوای گەوەر ڕۆزی دەدات بەو کەسەی بیەوێ بە بێ ژمار، پێغەمبەر زەکەریا ئەمەی دی لەمەریەم کە خوای گەورە ئەم ئافرەتە چاکەی لەبیرنەکردووە ڕۆزی بۆ دەنێرێ ئەویش خۆی بەبیرهاتەوە کە تەمەنی کردووەو هیچ نەوەی نیە ئاگری کەوتە هەناوو دەستی بەرز کردەوە بۆ لای پەروەردگاری بەسۆزو بەزەیی و بەخشندە ووتی ئەی پەروەرگارم لەلایەن خوتەوە نەوەیەکی پاکم پێ بدە بەڕاستی تۆ بیسەری نزاکانی، ئەوە بو خوا وەڵامی پێغەمبەر زەکەریایی داوەو یەحیای پێ بەخشی.

وە ئەمر بکەن ئەی باوکان بە خێزانو نەوەکانتان بە نوێژو زەکاتو بەندایەتی و ئەنجامدانی باقی فەرزەکان، وە پێغەمبەر ئیسماعیل بکەن بە پێشەواو مامۆستای خۆتان، سەیرکەن خوا لە قورئانەکەیدا چۆن بۆمان باس دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيًّا﴾ سورة مريم، الايە (٥٥) وە ئەو فەرمانی دەکرد بە خێزانەکەی بە نوێژو زەکات وە ئەو لای پەروەردەگاری ڕازی کراوە.

وە هەروەها ئامۆژگاری نەوەکانتان بکەنو فێری یەکتاپەرستی و تاوانی هاوبەش پەرستیان پێ بناسێنن کە ئەویش ستەمێکی زۆر گەورەیەو خوایان پێ بناسێنن کە خاوەنی تواناو دەسەڵاتو هێزێکی وایە کە هیچ کەسو شتێك شایستەی ئەوە نیە بکرێ بەهاوبەشی و هاو شێوەی کە ئەو زۆر وردبینو زانایەکی بەتواناو بێ هاوتایە، وە فێرو فرمانیان پێ بکەن بە نوێژو فرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپەو ئارام گرتن لەسەر ئەوەی کە دوچاری دەبن لەو ڕێگایەداو خەبەریان پێ بدەن کە ئەمە کارێکی زۆر گەورەو پیرۆزە، وەفێری خۆ بە بچوك زانینیان بکەن و بەلالوت سەیری خەڵکی نەکەنو بەکەم

تەماشای نەکەن‌و بە فیزو خۆ بە گەورە زانینەوە نەچن بەسەر زەویدا چونکە بەڕاستی خوا خۆشی ناوێ هەموو خۆ بەزل زان‌و لەخۆرازیەك، وەپێیان بڵێن با بە جوانی‌و بێ فیس‌و نەرم بڕۆن بەڕێوەو زۆر دەنگیان بەرزنەکەنەوە، چونکە دەنگی بەرزو بەهاوار شتێکی ناشیرینە، بەڕاستی خراپترین‌و ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە.

وەبۆ ئەمانەش ئەی باوکانی ئازیز لوقمانی حەکیم بکەن بە مامۆستاو مەشخەڵ‌و سەیری بکەن چۆن ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات، وە خوا لە قورئاندا سورەتێکی بەناو کردووە باسی دەکات کە چۆن ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات خوای پێ ئەناسێنێ‌و فێری ڕەوشت‌و ئاکاری جوان‌و ئاوەدانی دەکات بۆ تەواو زانیارییتان ئەی باوکانی خۆشەویست سەیری مانا‌و تەفسیری ئایەتی -١٢ تا ١٩ی سورەتی لوقمان بکەن.

ئەوەش بزانن لەداستانی ئەم کەڵە پیاوانەدا چەندین دەرس‌و پەندە هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ئەقڵێکی تەواون.

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ.......﴾ سورة يوسف، الاية(١١١)

وە بە گرنگم زانی کە لەگەڵ ئێوەی ئازیزو خۆشەویستی نەوەکان بچینە خزمەت چەند ئایەتێك‌و فەرموودەیەکی پێغەمبەری ڕەوشت بەرز(ﷺ) کە خوای گەورە شایەتی ڕەوشت بەرزی بۆ دەدات‌و دەفەرمووێ ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾سوره القلم، الايه (٤)وە بیکەینە مەشخەڵی ژیانمان‌و چرای تاریکی‌و نەزانی‌و نەفامیمان، چونکە خوای بەرزو بەهێز دەفەرمووێ:

﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ سوره الاحزاب، الايه (٢١)، لەگەڵ چەند داستانێکی پیاو چاکاندا تا بزانین چۆن نەوەکانیان پەروەردە کردووە، دەی کەوابوو با ئەوەی کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ با دەستی پێوە بگرین تا گومڕاو سەرلێ شێواو نەبین ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ

**الْعقاب﴾** سورة الحشر، الاية (٧)

ئەی دایکانو باوکانی ئازیز لە باخچەی فەرموودە(چل گوڵی گەشاوە بۆ دایەو باوە) دەکەم بەدیاری بۆ ئێوەی دڵ سۆزی نەوەکان تاوەکو نەوەکانتان بەجوانی پەروەردە بکەن بە پەروەردەیەکی ئیسلامیو موحەممەدی (ﷺ). وە ئەگەر هەر هەڵەیەك هەبوو ئەوا لە منەوەیەو داوای لێ خۆشبوون لەخوا دەکەمو ئێوەش هەروەها داوای لێخۆشبوونم بۆ بکەن، وە هەموو ڕاستیەکیش لە بەخشندەیی خوای بەخشندەوەو زانایە. (رَبَّنا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ * وتب عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)

(دعاء) پاڕانەوە:

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ سورة غافر، الاية (٤٠-٦٠)

١. ﴿رَبَّنا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾سوره البقره: (٢/ ١٢٧)، ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ال عمران (٣، ٣٨)، ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ﴾سوره ابراهيم : (١٤/ ٣٥)، ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ * وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ﴾ سوره ابراهيم(١٤/٤٠/٤١)، ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾الفرقان : ٧٤/٢٥، ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾النمل : (٢٧/ ١٩)، ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ الاحقاف : (٤٦/ ١٥)

(اللهم صلى على محمد وعلى أل محمد كما صليت على ابراهيم وعلى أل ابراهيم وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى أل ابراهيم انك حميد مجيد

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ سورة التوبة، الاية(٧١).

**٤٠ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ باوکان و دایکان:**

**١-(اخرج الشيخان عن ابن عمر رضى الله عنهما قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته، والرجل راع في أهله وهو مسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها وهي مسؤولة عن رعيتها والخادم راع في مال سيده وهو مسؤول عن رعيته، وكلم راعي وكلكم مسؤول عن رعيته).**

**لەم فەرموودە ڕاست و دروستەدا کە عەبدوڵڵای کوری عومەر ڕەزای خوایان لەسەر بێ بۆ مان باس دەکات و دەڵێ بیستم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: " هەموو یەکێك لە ئێوە شوانە، وە هەموو یەکێك بەرپرسە لە ڕەعیەت و بەردەستەکانی، و وەپیاو شوانە لەناو خێزانەکەیداوە بەرپرسە لەبەردەستەکانی ئافرەت شوانە لە ماڵی مێردەکەیدا وە لێپرسراوە لە ماڵ و منداڵ و هاوسەرەکەی، وە خزمەتکار شوانە لەماڵی گەورەکەی و بەرپرسە لەو شتەی لەبەردەستیدایە، وە هەمووتان شوانن وە هەمووتان بەپرسن لە بەردەستەکانتان"**

**٢-(اخرج البخاري عن أبي هريرة رضى الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله**

عيه وسلم " ما من مولود الا يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه أو ينصرانه او يمجسانه. كما تنتج البهيمة بهيمة جمعاء، هل تحسون فيها من جدعاء ؟ ثم يقول ابو هريرة رضى الله عنه يقول الله تعالى ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ الروم، الاية (٣٠).

"ئیمامی بوخاری لەباوکی هورەیرەوە ( رەزای خوای لەسەر بێ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی" هیچ منداڵێك لە دایك نابێ تەنها لەسەر بیروباوەڕێكی یەكتا پەرستی نەبێ، بەڵام باوكو دایك دەیگۆڕن یان دەیكەن بە جوو یا بە گاور یا ئاگر پەرست، هەروەكو چۆن گیانلەبەرێك بێچوویەكی دەبێ هەموو ئەندامەكانی تەواوە، ئایا ئێوە هەست دەكەن گوێیان شوێنێكی برابێ؟ " لەپاشان باوكی هورەیرە( رەزای خوای لە سەر بێ) وتی خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ الروم، الاية( ٣٠).

٣-( روي الترمذي عن ابي موسى(رضي الله عنه) ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: "إذا مات ولد العبد قال الله تعالى لملائكته : قبضتم ولد عبدي؟ فيقولون: نعم، فيقول : قبضتم ثمرة فؤاده؟ فيقولون : نعم، فيقول فماذا قال عبدي؟ فيقولون : حمدك وأسترجع، فيقول الله تعالى : ابنوا لعبدي بيتا في الجنة، وسموه: بيت الحمد"

پێشەوا ترمزی لە باوكی موساوە رەزای خوای لەسەر بێ، دەیگێڕێتەوەكە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: هەر كاتێ منداڵی بەندەیەك دەمرێ، خوای بڵند مەقام بەفریشتەكانی دەفەرمووێ: گیانی ڕۆڵەی بەندەكەمتان كێشا؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، خوای گەورەش دەفەرمووێ" بەروبوومی دڵی بەندەكەمتان كێشا؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵی خوای گەورە دەفەرمووێ: بەندەكەم چی دەگوت؟ ئەوانیش دەڵێن: سوپاسی تۆی دەكردو دەگەڕایەوە (یانی دەیگوت: إنا لله وإنا اليه راجعون) خوای گەورە

دەفەرمووێ: ماڵێك بكەنەوە بۆ بەندەكەم لە بەهەشتداو ناوی لێ بنێن: ماڵی حەمدو سوپاس".

٤-روى -احمد- بأسناد جيد- عن المقداد بن معد يكرب رضى الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ) : ما اطعمت نفسك فهو لك صدقة، وما أطعمت ولدك فهو لك صدقة، واما أطعمت زوجتك فهو لك صدق، وما أطعمت خادمك فهو لك صدقة.

. پێشەوا ئەحمەد- بە پاڵپشتییەكی دروست- لە مقدادی كوڕی مەعدیكەریبەوە - ڕەزای خوای لەسەر بێ-بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خواردنێك بەخۆتبدەی ئەوا بۆتۆ بە چاكە دەنوسرێ، وە خواردنێك بە نەوەكەت بدەی ئەوا بۆتۆ بە چاكە دەنووسرێ، وە خواردنێك بدەی بە هاوسەرەكەت ئەوا بۆتۆ بە چاكە دەنووسرێ، وە خواردنێك بدەی بە خزمەتكارەكەت ئەوا بۆتۆ بە چاكە دەنوسرێ".

٥- في الصحيحين، عن: عبدالله بن مسعود قال قلت: يا رسول الله (ﷺ) اي ذنب اعظم؟ قال ان تجمل لله نداً وهوخلقك" قلت ثم اي؟ قال ان تقتل ولدك خشية ان يطعم معك" قلت: ثم اي؟ قال: "ان تزاني بحليلة جاريك".

له صەحیحی بوخاریو موسلیم دا، لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا چ گوناهێ زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: "هاوار بكەیتە غەیری خوا لە حاڵێكدا ئەو دروستی كردووی" وتم لەپاشان چی؟ فەرمووی : "منداڵەكەت بكوژی لەترسی ئەوەی لەگەڵت بخوا- واتە لەترسی بەخێوكردن-. وتم: لەپاشان چی ؟ فەرمووی: زینا لەگەڵ خێزانی دراوسێكەت بكەی"

٦-اخرج البخاري: عن أبي هريرة رضى الله عنه قال: قال رسول الله(ﷺ) : قال سليمان لاطوفن الليلة على تسعين أمراة، كلهن تأتي بفارس يجاهد في سبيل الله، فقال له صاحبه: ان شاء الله، فلم يقل ان شاء الله فطاف عليهن

جميعا فلم يحمل منهن الا امراة واحدة، جاءت بشق رجل، والذي نفس محمد بيده، لو قال ان شاء الله، لجاهدوا في سبيل الله فرسانا اجمعون".

پێشەوا بوخاری لە باوکی هوەرەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت، بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لەسەر بێ فەرموویەتی: "پێغەمبەر سولەیمان فەرمووی ئەمشەو دەگەڕێم بەسەر نەوەد خێزانەکەمدا، هەر هەموویان یەکەو سوارچاکێکیان دەبێ و جیهاد دەکەن لە ڕێگای خودادا، ئەو هاوەڵەی لەگەڵ، بوو پێی وت: إن شاءالله، ئەو نەیفەرموو إن شاءالله، پاشان گەڕا بەسەر هەموویان دا، هیچیان سکی پڕ نەبوو بێجگە لە یەك ئافرەت ئەویش تەنها یەکپارچە کوڕی بوو، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر بیوتایە إن شاءالله، هەر هەموو سوارچاکەکان جیهادیان دەکرد لە ڕێگای خوادا".

٧- في الصحيحين عن ابن عباس (رضي الله عنهما) عن النبي (ﷺ) قال: (لو أن احدكم اذا أتى اهله قال: بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان مارزقتنا فقضي بينهما ولد لم يضره) وفي رواية للبخاري (لم يضره شيطان ابدا)

واتە: لەهەر دووسەرچاوە دروستەکەدا لەکوڕی عەباسەوەوە (ڕەزای خوا لەهەردووکیان) لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لەئێوە کاتێ دەچووە لای خێزانەکەی دەیوت: بەناوی خوا (بسم الله) ئەی خوایە پەنامان بدە لەشەیتان وەپەنای بدە لەشەیتان ئەوەی کەدەیبەخشی پێمان، وەپەیدا بوو لەنێوان ئەوانا منداڵێك شەیتان هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێ) لەبێژراوی بوخاریدا هاتووە (شەیتان ناتوانێ بەئەبەدی زیانی پێ بگەیەنێ).

٨-روى الامام احمد عن عائيشة رضى الله عنها: إن رسول الله (ﷺ) قال لها: يا عائشة ارفقي، فان الله اذا اراد باهل بيت خيراً دلهم على الرفق" وفي رواية " اذا أراد الله باهل بيت خيرا ادخل عليهم الرفق"

پێشەوا ئەحمەد لە دایکی باوەڕدارانەوە عائیشە ڕەزای خوای لەسەربێ بۆمان دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی بـە عائیـشەی خێزانـی: "ئەی عائیشە نەرمونیان بە چونکە ڕاستی خوا هەر کاتی بیـەوێ لوتفی چاکە بکـات بـە خێزانـی هـەر مالێـك ڕێنماییـان دەکـات لەسـەر نـەرموونیانی" لـە گێڕانەوەیەکی تریشدا هاتووە: "هەر کاتێ خـوا بیـەوێ لوتفی چاکە بکات بە خێزانی هەر مالێك نەرموونیانی دەخاتە سەریان".

٩-روى عن الترمذي عن أبي هريرة رضى الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ) " ما يزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه وولده وماله حتى يلقى الله وما عليه خطيئة".

پێشەوا ترمذي لە بـاوکی هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لەسـەر بێت) دەگێڕێتـەوە بۆمـان کـە دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا سـەلامی خـوای لەسـەر بێت، فەرموویـەتی" بـەردەوام بـەلاّو ناخۆشـی تووشـی پیـاوو ئـافرەتی بـاوەڕدار دەبـێ لـەخۆیو ڕۆڵەکەیو ماڵەکەی تاوەکو دەگات بە خواوە هیچ گوناهو تاوانێکی بەسـەرەوە نامێنێ[٢]".

١٠-في الصحيحين عن ابي مسعود عقبة بن عمرو البدري رضى الله عنه قال: جاء الرجل الى النبي (ﷺ) فقال: "اني لاتاخر عن صلاة الصبح من أجل فلان مما يطيل بنا" فما رأيت النبي(ﷺ) غضب في موعظة قط اشد مما غضب يومئذ فقال يا أيها الناس ان منكم منفرين، فايكم ام الناس فليوجز، فان من ورائه الكبير والصغير، و اذا الحاجة".

لـە هـەردوو کتێبـە ڕاسـتەکەی پێـشەوا بوخـاریو موسـلیمدا لـە بـاوکی مەسعودەوە کە دەکاتە عوقبەی کوڕی عەمری بەدری(ڕەزای خوای لەسـەر بـێ) دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەر(ﷺ) ووتـی: " مـن خـۆم دوادەخەم لە نوێژی بەیانی لەبەر فلان کـەس کـە زۆر نوێژەکـە درێـژ دەکاتـەوە لەسـەرمان" مـنش هـیچ ڕۆژێـك پێغەمبـەرم (ﷺ) نـەبینی تـووڕە بـێ زیـاتر لـە

تووڕەبوونی ئەو ڕۆژە، بۆیە فەرمووی: " ئەی خەڵکینە کە سانێك هەنە لەناو ئێوەدا خەڵك لەدین دەردەکەن‌و پاڵی پێوە دەنێن بۆ بێ دینی، کام لە ئێوە پێش نوێژی کرد بۆ خەڵکی با کورتی بکاتەوە، چونکە لە دوای ئەو کەسی بەتەمەن‌و بچووك‌و کەسی بە خاوەن ئیش هەیە"

١١-اخرج المسلم عن ابي هريرة(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) :( اذا مات الانسان انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، او ولد صالح يدعو له).

پێشەوا موسلیم لە باوکی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە بۆمان کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێ:" هەر کاتێك مرۆڤێك مرد کردەوەکانی لێ دەپچڕێت تەنها سێ شت نەبێ: خێرێکی بەردەوام‌و سوودبەخش! وەك دروستکردنی مزگەوتێك بۆ نموونە) ، یان زانیاریەك سوودی لێ وەربگیرێ، یان منداڵی چاك کە دوعای بۆ بکەن.

١٢-روى الامام احمد والنسائي عن معاوية بن قرة عن ابيه: إن رجلا كان يأتي النبي(ﷺ) ومعه ابن له، فقال له النبي(ﷺ): " اتحبه؟ فقال يا رسول الله احبك الله كما احبه، ففقده النبي (ﷺ) فقال: وما فعل ابن فلان؟ قالوا يا رسول الله ! مات، فقال النبي (ﷺ) لابيه" أما تحب الا تأتي بابا من ابواب الجنة والا وجدته ينتظرك عليه" " فقال رجل أله خاصة يا رسول الله، أو لكلنا؟ قال: " بل لكلكم).

پێشەوا ئەحمەدو نەسائی لە معاویەی کوڕی قوڕرەوە ئەویش لە باوکیەوە بۆمانی دەگێڕاوەێتەوە کە پیاوێك دەهاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وە ئەو پیاوە کوڕێکی خۆی لەگەڵ بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: " ئەو کورەت خۆش دەوێ؟ " ئەویش ووتی: ئەی ڕەوانەکراوی خوا، خوا تۆی خۆش بوێ وەك چۆن من ئەوم خۆشدەوێ: ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) منداڵەکەی لێ وون بوو پاشان فەرمووی: " لە کوێیە منداڵەکەی فلانە کەس" ووتیان ئەی پێغەمبەری

خوا مردووە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە باوکی" ئایا پێت خۆش نیە تۆ نەچیتە لای هیچ دەرگایەك لە دەرگاكانی بەهەشت تۆ دەستت كەویٚ منداڵەكەی خۆت لەسەر ئەو دەرگایە چاوەڕوانی تۆ بكات؟ " وە پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە تەنها بۆ ئەوە یان بۆ هەموومانە؟ فەرمووی": نەخێر بەڵكو بۆ هەمووتانە".

١٣-عن النعمان بن بشير ( رضي الله عنه) ان اباه أتى به رسول الله (ﷺ) فقال: "أني نحلت ابني هذا غلاما كان لي، فقال رسول الله (ﷺ) اكل ولدك نحلته مثل هذا؟" فقال : لا ، فقال: رسول الله(ﷺ): اعدلوا بين اولادكم في النحل، كما تحبون ان يعدلوا بينكم في البر واللطف).

نوعمانی كوڕی بەشیر "ڕەزای خوا لە خۆیو لە باوكی" دەگێڕێتەوە بۆمان كە باوكی بردویەتی بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی من بەخشیومە بەم منداڵەم كە كوڕی خۆمە باخچە خورمایەك، پێی فەرموو: ئایا بەهەموو نەوەكانت بەخشیوە وەكو ئەمە؟

ئەویش ووتی: نەخێر، وە پێغەمبەری خوا" سەلامی خوای لەسەربێت" پێی فەرموو: " دادپەروەرو یەكسان بەخشیش بن لە بەینی نەوەكانتان. هەر چۆنیٚ خۆتان پێتان خۆشە كە ئەوان دادپەروەربن لەبەینی ئێوەدا لە چاكەو دڵ سۆزیدا".

١٤-روى ابو داودو الترمذي عن عبيدالله بن أبي رافع، عن ابيه قال: رأيت رسول الله (ﷺ) أذن في أذن الحسن بن علي حين ولدته فاطمة بالصلاة.

پێشەوا باوكی داودو ترمزی لە عوبەیدوڵلای كوڕی باوكی رافع، لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە بۆمان دەڵیٚ: بینیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگی دا بەگوێچكەی حەسەنی كوڕی عەلی لەو كاتەی كە فاتیمە ئەوی بوو بەبانگی نوێژ.

١٥-في الصحيحين عن ابي موسى قال: ولد لي غلام، فأتيت به النبي (ﷺ)، فسماه ابراهيم، وحنكه بتمرة، وزاد البخاري: ودعا له بالبركة، ودفعه اليه.

لـه هـەردوو سەرچـاوه ڕاسـتەكەی پێـشەوا بوخـاریو موسـلیم دا هـاتووه لـه باوكی موساوه وتوویەتی"كوڕێكمان بوو، بردم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا ابـراهیم مەلاشـووی كـرد بـه خورمـا" بوخـاری ئەمـەی زیـاد باسـكردووه كـه دەگێڕێتەوەو دەڵێ: نزای پیتو فەڕی بۆ كرد، پاشان دایەوه پێم".

١٦-روی اصـحاب الـسنن عـن سمـرة قـال: قـال رسـول الله(ﷺ) : " كـل غـلام رهينة بعقيقته، تذبح عنه يوم السابع، ويسمى فيه ويحلق رأسه".

هاوەڵانی سونەن له سـەمرەوه دەگێڕێنـەوه كه دەڵـێ: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرموویـەتی" " هـەموو ڕۆڵەیـەك بەسـتراوه بـه عەقیقەكەیـەوه، ڕۆژی حەوتـەم سەر ئەبڕێ بۆی، وه لەو ڕۆژەدا ناو دەنرێتو سەری دەتراشرێت".

"عقیقه" بەو سەربڕینه دەوترێت كه له ڕۆژی حەوتەم دا دەكرێت بۆ منداڵ، بۆ كوڕان دوو مەڕەو بۆ كچانیش مەڕێكه ئەگەر هەبوو، ئەگەر نەشـبوو بـەگوێرەی توانای خۆت، دەڵێن لەناو پیاو چاكان هەبووه چۆلەكەیەكی سـەربڕیوه هێنـده به گرینگیان گرتووه.

١٧-روی الحاكم عن ابن عباس( رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) قال: "افتحوا على صبيانكم أول كلمة بلا اله الا الله، ولقنوهم عند الموت: لا اله الا الله.

پێـشەوا حـاكم لـه كـوڕی عەباسـەوه(ڕەزای خـوای لـەخۆی و لـەباوكی بێـت) دەگێڕێتـەوه بۆمـان لـه پێغەمبـەرەوه (ﷺ) فەرموویـەتی: "بیكەنـەوه لەسـەر مناڵەكانتان یەكەم ووشه به: لا اله الا الله وله سەرەمەرگدا پێیان بگەیەنن لا اله الا الله. مانـای لا الـه الا الله ئەوەیـه كـه هـیچ پەرسـتراوێكو هـیچ كەسێك نیـه گەردنی بۆ كەچ بكەیو فەرمانەكانی پێش هەموو فەرمانەكان بخەی تەنها خوا نەبێ(جل جلاله).

١٨-روی الامـام البخـاري والمـسلم عـن عمـر بـن ابـي سـلمة (رضـي الله عنهمـا) قال: كنت غلاما في حجر رسول الله (ﷺ) وكانت يدي تطيش في الصفحة، قال: لي رسول الله (ﷺ):"يا غلام سم الله، وكل بيمينك وكل مما يليك".

پێشەوا بوخاریو موسلیم لە عومەری کوڕی باوکی سەلەمەوە "ڕەزای خوایان لێبێ" دەگێڕتەوە بۆمان، دەڵێ: من منداڵێك بوم لەماڵی پێغەمبەر(ﷺ) وەلەکاتی نان خواردندا دەستم دەگێڕا بەناو قاپەکەدا بەکەیفی خۆم، پێغەمبەر پێی وتم(ﷺ): "ئەی منداڵ بڵێ بەناوی خوا وە بخۆ بەدەستی ڕاستت وەبخۆ لەوەی لەبەردەستو لای خۆتەوەیە".

١٩-روى الحاكم وابو داود عن ابن عمرو بن عاص (رضي الله عنهما) عن رسول الله (ﷺ) انه قال: "مروا اولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين، وضربوهم عليها، وهم ابناء عشر، وفرقوا بينهم في المضاجع".

پێشەوا حاکمو باوکی داود لە کوڕی عەمری کوری عاصەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) بومان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە ئەو فەرموویەتی فەرمان بکەن بەمنداڵەکانتان بە نوێژ کردن کەئەوان تەمەنیان حەوت ساڵ بێ، وەلێیان بدەن لەسەر نوێژ، کە ئەوان تەمەنیان دەساڵ بێ، وە جێگای پاڵدانەوەو خەوتنیان لەیەك جیا بکەنەوە هەر لە تەمەنی دەساڵیدا".

٢٠-روى ابن حبان عن أنس (رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) : أنه قال: "الغلام يعق عنه يوم السابع، ويسمى، ويماط عنه الآذى، فاذا بلغ ست سنين أدب، واذا بلغ تسع سنين عزل عن فراشه، فاذا بلغ ثلاث عشرة سنة ضرب على الصلاة والصوم، فاذا بلغ ست عشرة زوجه ابوه ثم اخذ بيده، وقال: قد أدبتك وعلمتك، وانكحتك، أعوذ بالله من فتنتك في الدنيا، وعذابك في الاخرة".

پێشەوا کوڕی حیبان لە ئەنسەوە (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە پێغەمبەر فەرموویەتی: "کوڕ عەقیقەی بۆ دەکرێت لە ڕۆژی حەوتەمداو ناو دەنرێو ئەو پارچە گۆشتەی ئەزیەتی دەدات لێ دەکرێتەوە، هەر کاتێ گەیشتە شەش ساڵی پەروەردە دەکرێ لەلایەن باوکیەوە، هەر کاتێ گەیشتە نۆ ساڵی جێگای جیا دەکرێتەوە، هەر کاتێ گەیشتە شازدەساڵی باوکی ژنی بۆ بێنێو لەپاشان دەستی بگرێو پێی بڵێ: من پەروەردەم

کردی‌و فێرم کردی‌و ژنم بۆ هێنای. پەنا ئەگرم بەخوا لە شەڕو شومی تۆ لە دونیا،و لە سزات لە ڕۆژی دوایی".

٢١-اخرج الشيخان عن الربيع بنت معوز قالت: أرسل رسول الله(ﷺ) صبيحة يوم عاشورا الى قرى الانصار: "من كان أصبح صائما فليتم صومه، ومن كان أصبح مفطرا فليصم بقية يومه" فكنا نصومه بعد ذلك، ونصوم صبياننا الصغار منهم. ونذهب الى المسجد فنجعل لهم اللعبة من المهن(الصوف) فاذا بكى احدهم للطعام اعطيناه اياه حتى يكون عند الافطار.

پێشەوا بوخاری‌و موسلیم دەریان هێناوە بۆمان‌و لە ڕەبیعی کچی موعەویزەوە ووتوویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە بەیانی ڕۆژی عاشورادا نەفەرێکی نارد بۆ دێکانی ئەنسار، هەر کەسێك لە بەیانیەوە بەڕۆژوو بووە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، وە ئەوەی بەڕۆژو نییە بابەڕۆژی بێ ئەوەی کە ماوە لەڕۆژکەی، ئێمە بەڕۆژوو بووین لە دوای ئەوە وە ڕۆژشمان بە منداڵە بچووکەکان گرت وەرۆشتین بۆ مزگەوتوو کەل‌و پەلی یاریمان بۆ دروست کردن لە خوری، وەهەر کاتێك یەکێك لە ئەوان دەگریا بۆ خواردن یاریەکەمان پێ ئەدا تا کاتی ڕۆژو شکاندن‌و بەربانگ".

٢٢-روى مسلم ومالك وابو داود والنسائي عن ابن عباس(ڕەزای خوای لەسەر بێ) ان رسول الله(ﷺ) لقى ركبا بالروحاء فقال: " من القوم ؟ قالوا: المسلمون: فقالوا: من أنت؟ قال: "رسول الله فرفعت أمراة صبيا، فقالت: الهذا حج؟ قال:"نعم ولك أجر".

پێشەوا موسلم‌و مالك وباوکی داودو نەسائی لە کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوا لە خۆی‌و باوکی بێت، دەگێڕێتەوە بۆمان کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشتە قافڵەیەك لە ڕەوحاغەرمووی:"کێیە ئەو قەومە؟" ووتیان:"موسڵمانان" ئەوانیش ووتیان: "ئەی تۆ کێی؟" فەرمووی" پێغەمبەری خوا" لەو کاتەدا ئافەرتێك منداڵێکی بەرز کردەوە ووتی: ئایا ئەمە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی:"

بەڵێ، وە پاداشتەکەی بۆتۆیە".

٢٣-روى ابوو داود عن عمرو بن شعيب رحمه الله، عن ابيه عن جده: أن امراة اتت رسول الله(ﷺ) ومعها ابنة لها وفي يد ابنتها مسكتان غليظتان من ذهب فقال لها:"اتعطين زكاة هذا؟ قالت: لا قال"ايسرك ان يسورك الله بهما يوم القيامة سوارين من نار؟" قال: فخلعتهما فألقتهما الى النبي "(ﷺ) وقالت: هما له ولرسوله.

پێشەوا باوکی داود لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە بۆمان : کە ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە لە گەڵیدا بو کچێکی، وە لە دەستی کچەکەیدا بوو دوو بازنگی ئەستوری ئاڵتون" زێڕ" وە پێی فەرموو" ئایا زەکاتی ئەوەت داوە؟"

وتی: نەخێر، فەرمووی: "ئایا پێت خۆشە کە خوا لە باتی ئەو دوانا لەڕۆژی دوایدا دوبازنگی ئاگرینی لەدەست بکات؟" دەڵێ: هەردوکی لەدەست کردەوەو خستییە بەر دەست پێغەمبەر(ﷺ) ووتی: ئەو دوانە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی.

٢٤-روى الشيخان ومالك والنسائي وأبو داود عن عبدالله بن عمر(رضى الله عنهما) قال: "فرض رسول الله(ﷺ) زكاة الفطر صاعا من تمر؟ ، أو صاعا من شعير، على كل عبد، أو حر، صغير أو كبير.

پێشەوا بوخاریو موسلیمو مالیكو نیسائیو باوکی داود لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە رەزای خوا لە خۆیو باوکی بێت، بۆمان دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی:"پێغەمبەری خوای فەرزو واجبی کردووە سەرفترە یا سەر چاککردنەوە لەمانگی رەمەزاندا مەنیجێك(*) خورما، یا مەنیچێك لە جۆ لەسەر هەموو بەندەیەك یاخود ئازادێك، بچووك بێ یا گەورە."

---

(*)مەنیج (صاع) پێوانێکی خەڵکی مەدینەیە کە لەهەر جۆرەیەکیان پێوانو وەزنێکی جیاوازی هەیە

٢٥-روي النسائي من طريق جعفر بن سليمان عن ثابت: آن النبي (ﷺ) كان يزور الانصار، فيسلم على صبيانهم، ويمسح على رؤوسهم ويدعو لهم.

پێشەوا نیسائی لە ڕێگای جەعفەری کوڕی سولەیمان لەسابیتەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری(ﷺ) سەردانی ئەنساریەکانی دەکردو سەلامی لە منداڵەکانیان دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریاناو دوعای خێری بۆ دەکردن.

٢٦-عن عبدالله (ر.ض) قال: قال رسول الله (ﷺ): "احب العباد عند الله تعالى انفعهم لعياله" حسنه ألباني.

عەبدوڵلا (ر.خ) دەگێڕێتەوە بۆمان دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی: "چاکترین بەندە لای خوای گەورە چاکترینو خێردارترینیانە بۆ خێزانەکەی".

٢٧-روي ابن ماجة عن انس بن مالك(ر.ض) : عن النبي(ﷺ): أكرموا اولادكم وأحسنوا أدبهم".

پێشەوا کوری ماجە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە( ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە بۆمان لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) :"ڕێز لە منالەکانتان بنێنو بەجوانی پەروەردەیان بکەن".

٢٨-روي الامام احمد والطبراني عن عبادة بن الصامت ان رسول الله (ﷺ) قال: "ليس من أمتي من لم يحترم كبيرنا، ويرحم صغيرنا، ويعرف لعالمنا حقه".

پێشەوا ئەحمەد وتەبرانی لەعوبادەی کوڕی سامتەوە دەگێڕنەوە بۆمان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لەئومەتی من نییە ئەو کەسەی ڕێز لەگەورەکانمان نەگرێ ، وبەزەیی بە بچوکەکانمانەیتەوە. وەماف و پلەو پایەی زاناکانمان نەزانێ).

٢٩- روى الامام احمد عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن رسول الله (ﷺ) انه قال: (من قال لصبي تعال هاك اعطك،ولم يعطه، فهي كذبة.

پێشەوا ئەحمەد لەباوکی هویرەوە(ڕەزای خوای لەسەر بێ) بۆمان دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەر (ﷺ) کەئەوفەرموویەتی: (هەرکەسێك بڵێ بەمنداڵێ

وەرە ئەوەت بدەمێ وەهیچی نەداتێ،؟ ئەوە درۆیەکە لەسەری).

٣٠-روى الشيخان عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قبل النبي الحسن بن علي(رضي الله عنه) فقال الاقرع بن حابس: إن لي عشرة من الواد ما قبلت منهم أحد، فقال رسول (ﷺ): " من لايرحم لا يرحم".

پێشەوا بوخاری و موسلیم لەباوکی هورەیرەوە (ر.خ) بۆمان دەگێڕتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچکرد (ڕەزای خوا لەسەر هەردووکیان بێ)، جا ئەقرەعی کوڕی حابیس ووتی: " ڕاستیەکەی من دە منداڵم هەیە هەرگیز هیچ یەك لەوانم ماچ نەکردووە" پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: "هەر کەسێك بەزەیی نەکات بەزەیی پێ ناکرێت".

٣١- عن ابن عباس رضي الله عنهما: قال : قال: رسول الله (ﷺ) ( اذا غربت الشمس فكفوا صبيانكم، فانها ساعة ينتشر فيها الشياطين).

کوڕی عەباس (ڕەزای خوا لەخۆی و باوکی) دەگێڕتەوە بۆمان، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێ ڕۆژ ئاوا بو ئێوە منداڵەکانتان ببنەوە ژور، چونکە بەڕاستی ئەوەکاتێکە کەشەیاتینەکان تێیدا بڵاو دەبنەوە).

٣٢- روى البخاري عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) : " أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا" فأشار بالسبابة والوسطى، وفرج بينهما".

پێشەوا بوخاری لە سەهلی کوڕی سەعدوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە بۆمان و دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "منو ئەو کەسەی سەرپەرشتی هەتیوێك دەکات لە بەهەشتدا ئاواینە" ئینجا ئاماژەی کرد بە پەنجەی ئامازەو ناوەڕستو جیای کردنەوە لەیەك".

٣٣-روى الترمذي عن عمرو بن شعيب رحمه الله عن ابيه عن جده: ان النبي (ﷺ) انه خطب الناس فقال: "الا من ولي يتيما له مال فليتجر فيه، ولا يتركه حتى تأكله الصدقة".

پێشەوا ترمزی لە عەمری کوری شوعەیبەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) ئەویش

له باوکیەوە کە لە باپیرەیەوە دەیگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) وتاری بۆ خەڵك دەدا فەرمووی :"ئاگاداربن هەر کەسێك سەرپەرشتی هەتیوێك دەکاو ئەو هەتیوەش ماڵی هەبێ با ئەو کەسە بازرگانی بە ماڵەکەی بکاتو وازی لێ نەهێنێ تا وەکو زەکات هەموو دەخوات".

٣٤-روی ابو داود و الترمذي وعن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) " الراحمون يرحمهم الرحمن، ارحمو من في الارض يرحمكم من في السماء".

پێشەوا باوکی داودو ترمزی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومرەوە (رەزای خوایان لەسەر بێت)، دەگێڕتەوە بۆمان دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: " بەبەزەییەکان خوای بەبەزەیی بەزەیی پێیاندا دێتەوە ، بەزەیتان بێتەوە بەوەی لەسەر زەویە بەزەیی پێتان دێتەوە ئەوەی لە ئاسمانە، کەخوایە(جل جلاله).

٣٥-اخرج البخاري ومسلم والنسائي- عن أنس- (رضي الله عنه) ان رسول (ﷺ) قال: "والذي نفسي بيده! لا يؤمن احدكم حتى اكون احب اليه من و الده وولده والناس أجمعين".

پێشەوا بوخاریو موسلیمو نسائی لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لەسەر بێ) بۆمان دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:"سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە! هیچ کام لەئێوە باوەڕی نیە هەتاوەکو منی لا خۆشەویست تر نەبێ لە باوکیو نەوەکەی و هەموو خەڵکی".

٣٦-روي مسلم عن انس(ر.ض) قال: قال رسول الله (ﷺ) : من عال جاريتين حتى تبلغا، جاء يوم القيامة اناوهو هكذا"وضم اصابعه.

پێشەوا مسلیم لە ئەنەسەوە (ر. ض) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری (ﷺ) دەفەرمووێ: " هەر کەسێك سەرپەرشتی دو کچ بکات تاوەکو پێدەگەن، دێت لەڕۆژ ی دواییدا منو ئەو ئەوەها " پەنجەکانی پێکەوە نووساندبوو.

٣٧-روي ابو داود عن عائيشة (رضي الله عنها) ان اسماء بنت ابي بكر(رضي

الله عنها) دخلت على رسول الله (ﷺ) وعليها ثياب رقاق، فأعرض عنها، وقال: يا اسماء! ان المرأة اذا بلغت المحيض لن يصلح ان يرى منها الا هذا وهذا" واشار الى وجهه وكفيه.

پێشەوا باوکی داود لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لەسەر بێ) بۆمان دەگێڕێتەوە، کە ئەسمای کچی ئەبوبەکر(ڕەزای خوا لەسەر) لەخۆیو باوکی، هاتەلای پێغەمبەری خوا ، درودی خوای لەسەر بێت، پۆشاکێکی تەنكو ناسکی لەبەر بوو، وە پێغەمبەر (ﷺ) پشتی تێکرد، وەفەرموی" ئەی ئەسما! هەر کاتێك ئافرەت گەشتە عادە بەهیچ شێوەیە دروست نیە بۆی کەببینرێت لە ئەو تەنها ئەمەو ئەمە نەبێ" وە ئاماژەی کرد بۆ دەمو چاوو ناو دەستی.

٣٨-روى مسلم عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنه) قال: رأى النبي(ﷺ) علي ثوبين معصفرين فقال: "أمك امرتك بهذا؟!" قلت: اغسلهما ! قال: "بل احرقهما" وفي رواية فقال: " ان هذا من ثياب الكفار فلا تلبسهما".

پیشەوا موسلیم لە عەبدوڵلا کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە(ڕەزای خوا) لەخۆی باوکی بێت- بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیغەمبەر(ﷺ) بینی لەبەرمدا دوو پۆشاکی زەرد وە فەرمووی:"دایکت فەرمانی پێکردووی بە لەبەرکردنی ئەمە؟!" وتم : دەیان شۆرم! فەرمی "نەخێر بیان سوتێنە" وەلەبێژراوێکی تر دا هاتووە کە فەرموویەتی : " بەڕاستی ئەوە لە پۆشاکی بێ باوەڕانە تۆمەیان بۆشە".

٣٩-روى ابو داود عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال رأى رسول الله (ﷺ) صبيا حلق بعض رأسه وترك بعضه فنهاهم عن ذلك وقال (احلقوه كله او اتركوه كله).

پێشەوا باوکی داود لەکوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوا لەخۆی باوکی بێت)بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) منداڵێکی دی کەبەشێك لەپرچی کورت کراوەتەوەو بەشێکی بەجێ هێنلاوە وەك ئەمڕۆپێی دەڵێن (حەفر)وە

بەرگری ئەم کارەی لێ کردن و فەرمووی (هەمووی بتاشن یا خود هەمووی وازلێ بێنن).

٤٠-روى الامام احمد وابن ماجه والبخاري في "الادب المفرد" عن معاذ (رضي الله عنه) قال: أوصاني رسول (ﷺ) بعشر كلمات.

پێشەوا ئەحمەدو کوڕی ماجەو بوخاری لە "الادب المفرد" لە موعازەوە(رەزای خوای لەسەر بێ) بۆمان دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردم بەدە وشە:

١) لا تشرك بالله شيئا وان قتلت وحرقت.

هاوبەش بۆ خوا دامەنێ بەهیچ شتێ ئەگەرچی کوژرابی و سوتێنرابی.

٢) لاتعقن .والديك وان امراك ان تخرج من اهلك ومالك . وە ئازاری دایك و باوکت مەدە وەئەگەر چی ئەوان فەرمانیان پێ کردی دەربچی لەناو خێزان و ماڵەکەت.

٣) ولا تتركن صلاة مكتوبة متعمدا، فان من ترك صلاة مكتوبة متعمدا فقد برئت منه ذمة الله.

وە واز مەهێنە لەنوێژە فەرزکراوەکان، بەئەنقەست، چونکە بە ڕاستی هەر کەسێك واز بهێنێ لە نوێژە فەرزەکان بە ئەنقەست ئەوا دورە لە ئە و چاودێری و پارساتنی خوایی.

٤)ولا تشربن خمرا فان رأس كل فاحشة.

وە ئارەق مەخۆرەوە چونکە بەڕاستی ئارەق سەرچاوەی هەموو خراپەو پیسیەکە.

٥)وإياك والمعصية، فان بالمعصية حل سخط الله.

وە تۆ ئاگاداربەو خۆت بپارێزە لە سەرپێچی خوا، چونکە بەڕاستی بەسەرپێچی حاسل دەبێ خەشم و توڕەیی خوا.

٦)وأياك والفرار من الزحف وان هلك الناس.

وه تۆ خۆت بپارێزه له هەڵ هاتن لە ڕۆژی شکسدا وەئەگەرچی هەموو خەڵك فەوتان.

٧) وإذا اصاب الناس موت وانت فيهم فاثبت.

وه هەرکاتێ خەڵك توشی مردن بوون وه تۆ لەناویان بووی خۆڕاگربە.

٨) وأنفق على عيالك من طولك.

وه ببەخشە بەسەر خێزانەکەتدا له توانای خۆت.

٩)ولا ترفع عنهم عصاك ادبا.

وه دار دەستەکەت هەڵمەگره لەسەریان بۆ ئامۆژگاری.

١٠) وأخفهم في الله.

وه بترسە لەخوا سەبارەت به وان.

**١- دایکی شەهیدەکان**

عەفرای کچی عوبەیدەی کوڕی سەعلبەت مسوڵمان بوو پەیمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) و خوای گەوره حەوت کوڕی پێ بەخشی هەموویان له جەنگی بەدرا به موسڵمانی ئامادەبوون، وه ئەو مێردی کرد بەحاریسی کوڕی ریفاعەت لەو موعازو موعەویزی بوو لەپاشان تەڵاقی دا، وه هاتەوه مەککە، و مێردی کرد به بەکیری کوڕی عەبدیا لەیل، وه لەویش خالیدو ئیاس و عاقیل و عامری بوو لەپاشان گەڕایەوه بۆ مەدینە لەپاش مردنی بەکیر، وەحاریسی کوڕی ریفاعەت چویە خوازبێنی و هێنایەوه لەپاشان لەو دووباره عەوفی بو هەموویان لە بەدردا به موسڵمانی ئامادەبوون، لەبەدردا موعازو موعەویزو عاقیل شەهیدبوون، وه خالید لە ڕۆژ ڕەجیعدا، وه عامر لە ڕۆژی بیری مەعونەدا، وه ایاس له ڕۆژی یەمامەدا شەهید بوون.

ئا بەم شێوەیە بوو بەدایکی شەهیدەکان.

بێگومان ئەم دایکە بەهەشتی لەلایەن خواوه مسۆگەره، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ خوای گەوره لەڕۆژی دولییدا حەفتا کەس به شەهید

دەبەخشێ لەخزمو کەسانی باوەڕداری ئەی ئەو دایکەی کە باوەڕداربێ‌و دایکی شەهید بێ؟!

**٢-ژنە شیر فرۆشەکەو چەند دەرسێکی گرنگ.**

پێشەوای باوەڕداران عومەری فاروق(ر.خ) لەسەردەمی جێنیشتنی خۆیدا شەوان دەگەڕاو دەی پێچاوە لە بارودۆخی بەردەستەکانی‌و هاولاتیانی،

وە شەوێك دەگەڕاو گوێ بیستنی ژنێك بو دەیگوت بە کچەکەی : هەستە بڕۆ بۆ لای شیرەکەو هەندێ ئاوی تێکە، وە کچکە وەلامی دایەوە:

ئەی دایە گیان، ئەی نەت زانیوە بەفەرمان‌و بڕیاری پێشەوای باوەڕداران؟

وە ژنەکە وتی: چی بووە بڕیاری ئەو ئەی کچەکەم؟ وتی : ئەو فەرمانی کرد بانگەوازکار بانگەواز بکات : کە شیرەکان زۆر نەکەن بە ئاو. وەوتی نەخێرگوێی مەدەیەو دیسان وتی:

ئەی کچەکەم : هەستە بچۆ بۆ لای شیرەکەو زیادی بکە بەئاو، چونکە تۆ لە شوێنێکی کە عومەر نات بینێ، وە بانگەوازکارەکەی عومەریش نات بینێ، وە کچەکەش وەلامی دایەوەو یەکسەر گووتی: ئەی دایە گیان، ئەگەر عومەر نازانێ خۆ خوای عومەر دەزانێ، سوێند بەخوا من گوێڕایەڵی خوا ناکەم لەناوخەڵکیداو بێ ئەمریشی بکەم لەچۆڵەوانیدا.

کاتێ رۆژ بووە عومەر، وتی بە عاصم ی کوڕی، بڕۆ بۆ فلان‌و فلان جێگا چونکە بەڕاستی لەو جێگایە کچێکی لێیە، ئەگەر ئەو کەسی لە داخوازی نەبوو تۆ داخوازی بکەو بیهێنە، بەڵکو خوا پێت ببەخشێ، لە ئەو نەوەیەکی چاك‌و بەکەڵك،

وە تەماشاکردن‌و فیراسەتی فاروق راست بوو(رەزای خوای لەسەر بێ) وە عاسم ئەو کچەی هێناو، ئەو کچە لە عاسم کچێکی بو ناوی دایکی عاسم بو عەبدولعەزیزی کوڕی مەڕوان دایکی عاسمی هێنا لەو عومەری کوڕی عەبدول عەزیزی بو کە پیشەوایەکی دادپەروەر بوو-رحمه الله .

ئەی باوکانی ئازیز لە و داستانە دا چەندەرسێکی گرنگمان دەسکەوێ کە ئەوە لێرا مەبەستی ئێمە یە ئەوەیە ئەگەر ئێمەی باوك خۆشمان پلەو پایەو ماڵێکی دونیامان هەبێ نابێ ئەمە بکەینە هەموو شتێك‌و هەوڵی ئەوە بدەین کە کەسێکی وەکو خۆمان ناودارو سەرمایەدار بکەین بەهاو شانی خۆمان‌و نەوەکانمان، بەڵکو پێویستە زۆور یش گرنگە کە زاناو دڵسۆز عومەری کوڕی خەتاب بکەینە پێشەوامان چونکە ئەویش پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردووە بە پێشەوای خۆی‌و ئامۆژگارییەکانی ئەوی لەیاد نەکردووە کە دەفەرمێ(ئافرەت بۆ چوار شت دەخوازێت، بۆ جوانی‌و حەسب‌و ماڵ‌و دین تۆ خاوەن دینەکە بینە دەستت لە خۆڵ بدات ئەگەر نەی هێنی).

دەی تۆش ئافرەتێ کی خاوەن ڕەوشت‌و باوەڕدارو لەخوا ترس بێتە بۆ نەوەکەت وە هەروەها بۆ کچەکەشت گەنجێکی بەڕەوشت‌و لە خوا ترس ببینەوە، تا وەکو سبەی ڕۆژێ پێی سەر بەرزبی لە دونیاو دواڕۆژدا.

**٣-ئامۆژگاری لقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی.**

"ئەی کوڕی خۆم ئەگەر تۆ بە گومانی لەمردن تۆ مەخەوە! چاك بزانە تۆ چۆن دەخەوی هەر وەهاش دەمریت".

وە ئەگەر تۆ بەگومانی لە زیندووبوونەوە هەڵمەستەوە بە ئاگامەیە لە پاش خەوتنت! وە بزانە هەر ئاوەهاش زیندو دەبیەوە لەپاش مردنت!!.

بەڕاستی داناى‌و دڵسۆزی ئەم باوکە بۆ نەوەکەی زۆر ڕون‌و ئاشکرایە کەنەوەکەی لەدو شت ئاگادار دەکاتەوە ئەگەر بێت‌و نەوەکانی ئێمە لێیان ئاگادارىن ژیانی دونیامان دەکەوێتە قیمەی خۆشی‌و بەختەوەری بۆچی؟ چۆن؟ لەبەرچی؟.

بۆ ئەوەی هەرکەسێك دڵنیابێ لەمردن وەکو دڵنیایە لەخەوتن ئەوا دڵی کەس ناشکێنێ بەناڕەواو کەس ئازار نادات‌و مافی کەس بۆخۆی زەفت ناکات چونکە دەزانی هەرچەندی هەبێ دەبێ هەربخەوێ کەواتە دەبێ هەربمرێ‌و

بەجێی بێڵێ.
ئەگەر دڵنیابێ بەزیندو بوونەوە وەك دڵنیایی بەئاگاهاتنەوە لەخەوتن ئەوا کارێك ناکات کەلەخەوی مرندا تووشی ئازارو ترسانی بکات چونکە هەموویەکێ: لەئێمە دەزانین خەونی ناخۆشی ناوخەومان چەندە بەئازارە بەڵام نەوەکانی ئەمڕۆمان لەبەرنەبوونی باوکێکی ئاوا دڵسۆز هەموویان وەك هەتیوان پێدەگەن بێ ئامۆژگاری و لێپرسینەوەو ئاگادارکردنەوە لەڕۆژی دواتروزیندووبوونەوەو لێکۆڵینەوە لەدادگای پەروەردگاری بیسەرو بینەر.

**٤- ئامۆژگاری ئەسمای کچی خارجەت**

دەگێڕنەوە کەئەسمای کچی خارجەت شەوی بوکێنی بەکچەکەی وت:

(ئەی کچی شیرینم ! تۆ دەرچووی لەلانەیەك کەتێیداو ولفەتت گرتووەو وپێگەیشتووی، رۆیشتووی بۆ جێگایەك کەنای ناسی و ناشارەزای، وەهاودەمێك کە ولفەتت پێوە نەگرتووە! دەی کەواتە بۆ ئەو ببە بەئەرز، ئەویش بۆ تۆ دەبێت بەئاسمان، وتۆ بۆ ئەوببە بەلانك ئەویش بۆ تۆ دەبێتە کۆڵەگە، و تۆ بۆ ئەو ببە بەکەنیزە، ئەویش بۆتۆ دەبێ بەخزمەت کار، تۆ بپارێزە لوت و گوێ وچاوی.

*بابۆن نەکات لەتۆ تەنها بۆنی خۆش نەبێ، وەگوێ بیست نەبێ لەتۆ تەنها قسەی خۆش بەبێ وەنەبینێ لەتۆ تەنها جوانی نەبێ.

بەداخەوە ئەمڕۆ کچانی بێتاوان بەدەستی دایکی نەزان و نادڵسۆز دووچاری هەزاران کێشە دەبن و واز لەمێردو منداڵ و ماڵ دێنن دێنەوە بەردەستی ئەم دایکە شەیتان سیفەتەو نەوەکانیان بەرەڵای کۆڵان و ماڵان دەکەن.

دایکان لەباتی بڵێن بەکچەکانیان رووخۆش بن دەڵێن، ئەگەر پیاوەکەت وتی سیر بڵێ بیاز وتی شیر بڵێ قیر وتی ماندووم بڵێ مردوم. لەباتی بڵێ کچم زۆر تەکلیف مەبە لەگەڵ مێردەکەت بە.

خۆت قورس مەکە وەبۆ کوێ چوو لەگەڵی بەو تووشی حەرام و شەرمەزاری

خواو خەڵکی مەکە! بەڵکو دەڵێ دەبێ ئەوەندە زێرو ئەوەندە جلكو تاقم ماڵو مۆدیل وسەفرەو پارك چونكە بەخۆی نەی كردوە لای هاوسەری دەیەوێ بەکچەکەی هەموو قەزا بکاتەوە.

قسەکانی ئەسماو زۆرینەی دایکانی ئەمڕۆ وەك مانگو کرمە هەسارەو بەهارو قەوزەو میسكو ئارە قەوان.

ئەی دایکان هەر بەگوێی خۆتان بکەنو کچەکان ئێوەش بەگوێی دایکتان بکەن بازو بگەڕێنەوە بۆ لایان کچانی ئەمڕۆ خاوەنی ئەم دایکانەن بۆیە ڕێژەی تەلاق ولێدان و کوشتن بەرێژیەکی چاوەڕوان نەکراو بەرزبووەتەوە.

ئەی دایکان چاولەم ئافرەتە دڵسۆزە بکەن هەتاوەکو ژیان مابێ ناوی ووقسەکانی لەدونیا دادەمێنێتەوە.

**٥- ئامۆژگاری عەباس بۆ عەبدوللای کوری (رەزای خوایان لەسە ربێ)**

عەبدوڵڵای کوڕێ عەباس (رەزای خوایان لەسە ربێ) دەڵێ: بابم پێی وتم: ئەی کوڕم! من دەبینم پێشەوای باوەڕداران بانگت دەکاتو لەخۆی نێزیکت دەکاتەوە وەپرسورات پێ دەکات لەگەڵهاوەڵانی پێغەمبەر ی خوا (ﷺ) لەمنەوە وەری بگرە سێ ئاکار:

١- درۆت لێ نەزانێ

٢- پەنامەکیەکانی بۆ ئاشکرانەکەی.

٣- غەیبەتی کەس نەکەی لای ئەو.

عامری شەعبی دەڵێ: هەموویەکێك لەمانە چاکترە لەهەزار.

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ((رەزای خوایان لەسەر بێ)) دەڵێ: هەموو یەکێك لەمانە چاکترە لەدەهەزار.

ئەی دایکان وباوکانی ئازیز ئەم داستانو ئامۆژگاریانە بکەن بەچرای تاریکی نەوەکانتان.